## قورئان بیرکردنەوە وکارکردن پێی

# (سورەتی القدر)

کۆکردنەوەوئامادەکردنی
أیادمحمدقادر (ابو إلیاس)

١٤٤١هیجری -٢٠٢٠ زاینی

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب:قورئان بیرکردنەوە و کارکردن پیٚ ی (سورەتی القدر)

ئامادەکردنی : أیـادمحمد قـــادر (أبو إلیاس)

پێداچوونەوە : مامۆستا بهمن کەلاری

تایپ ودیزاین : م.سیروان شێخ لەنگەری

ساڵی چاپ :١٤٤١ هیجری –٢٠٢٠زا ینی

چاپ: چاپی یەکەم

پ١/ ئایە قورئان لەمانگی ڕمەزان و لەشەوی قەدردا دابەزیوە؟

وڵام/ (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ ) (القدر-١ )

واتە: ئێمە بەڕاستی قورئانمان دابەزاندۆتە خوارەوە لە شەوێکی بەفەڕو ڕێزداردا. خودای گەورە ئاگەدارمان دەکاتەوە کە قورئان لەشەوێکی بەڕێزو پیرۆزدا دابەزیوە کەشەوی قەدرە لەئایەتێکی تردادەفەرموێت:﴿إِنَّا أَنزلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ﴾(الدخان-٣) واتە: بەڕاستی ئێمە لە شەوێکی بە فەڕو پیرۆزدا (کە شەوی قەدرە) (قورئان)مان دامانبەزاندوەتە خوارەوە. وە شەوی قەدریش ئەو شەوەیە کە دەکەوێتە مانگی ڕەمەزان بەبەڵگەی ئەم ئایەتە: (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ) (البقرة :١٨٥) واتە:مانگی ڕەمەزان (ئەو مانگەیە) کە قورئانی تیادا هاتۆتە خوارەوە.(ئیبن عباس )دەڵێت: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە خوای گەورە قورئانی پیرۆزی تیادا ناردە خوارەوە هەر هەمووی بەیەکجار لە (لوح المحفوظ)ەوە بۆ (بيت العزه) لە ئاسمانی دونیا لەوێشەوە بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەزیووە ،لەماوەی بیست و سێ ساڵدا بەپێ ی ڕوداوەکان ،یەکەم ئایەت لە مانگی ڕەمەزاندا دابەزیوە لە شەوی قەدردا. (تفسير ابن كثير ١/١٩٤)

پ٢/واتای(ليلەالقدر) چیە؟

وڵام / (وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ) (القدر-٢)

واتە: تۆ چووزانیت شەوی بە ڕێز و قەدر وبەپیت وفەڕ چییەو چەندە بەبەرەکەتە. زانایان دەڵێن (لَيْلَةُ الْقَدْرِ) دوومانای هەیە: یەکیکیان بە مانای پلە و پایەی بەرز وبڵند دێت ، دەڵێن **(فلان ذو قدر العظيم)** واتە فلاَن کەس خاوەن قەدریکی زورە واتا خاوەنی مەنزیلەت و ڕێزیکی گەورەیە، ڕێزی هەیە لە ناو خەڵکداو پلەو

پایەی هەیە لەناو خەڵکدا.(وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ) بۆ مەبەستی بەگەورە دانان و گەورەکردنی ئەوکارە بەکاردەهێنرێت و سودی لێ دەبینرێت، لەقورئاندا لەئایەتێکی تردادەفەرموێت (وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ) (القارعة -٣) واتە: تۆ چوزانیت داچڵەکێنەر چییە؟ بۆمەبەستی بەگەورە زانینە. کەواتە (ليلة القدر) شەوێکی خاوەن ڕێزو مەنزیڵەت و پلەو پایەی گەورەیە. (تفسير ابن عثيمين /جزءعم/٢٧٠)

مانای دووەمیشیان (القدر) بە مانای (ليلة التقدير) دێت واتا نە خشەکێشان و قەزاو قەدەر کە لە قەزاو قەدەرەوە هاتووە،پەروەردگار چارەنووسی مروڤ بنوسێت. (لَيْلَةُ الْقَدْرِ) واتە ئەوشەوەیە کە(التقدير) ی ساڵانە دادەنرێت.خوای پەروەردگار نەخشەی ژیانی ئەو مروڤە بۆ ساڵێك کە بێگومان لەئەزەلەوە نوسراوە بەڵام لەو شەوەدا بۆ مەلائیکە دەری دەخات وجیای دەکاتەوە و دیاری دەکات (التقدير)ی ژیانی مرۆڤی تیادا دەکریت چارەنووسی مرۆڤی تیادا بڕیار دەدرێت بۆ ساڵێك جا هەردوو ماناکەیشی تەواو و دروستە، خوای پەروەردگار لە سورەتێکی تردا کە دەفەرمووێت: (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنْذِرِينَ (٣) فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ) (الدخان ٣-٤) واتە: بەڕاستی ئێمە ئەم قورئانەمان لە شەوێکی پیرۆزدا ناردۆتە خوارەوە بێگومان ئێمە ترسێنەرین. لەو شەوەی کە قورئانی تیادا دابەزیوە یەکەم شەوێکی موبارك وپیرۆزە، دووەمیشیان لەو شەوەدا هەموو ئەمرێك کەحیکمەتەو کارلەجێیە جیادەبێتەوە، (لەم شەوەدا تا ساڵێکی تر بڕیار دەدرێت فلانە کەس دڵ خۆشە یان دڵخۆش نییە، فەقیرە یان دەوڵەمەندە، نەخۆشە یان لەش ساغە بەڵاوموسیبەت وعافیەت و هەموو شتێکی تا ساڵێك لەم شەوە دا بۆبڕیار دەدرێت) (حديث المساء من الدروس والمحاضرات والتعليقات بنباز/ ٢٢٥)

الازهری دەڵێت: (لَيْلَةُ الْقَدْرِ) بەواتای شەوێکی گەورە وبەپلەو پایەیە، وەکو خەڵکی دەڵێن فلأنە کەس لای ئەمیر(قەدر)ی هەیەو ڕێزو پلەو پایەی هەیە ودەڵێن(قەدری فلأنم گرت)واتە بەگەورە و بەڕێزم دانا. خودای گەورە لەئایەتیکی تردا دەفەرمویێت: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ﴾ (الزمر-٦٧) واتە: ئەوانە وەکو پێویست خوایان نەناسی و ڕێزیان لێ نەگرت.

ودەڵێن کردەوەی چاك لەو ڕۆژانە (قەدر)و پلەوپایەی خۆی هەیە لەبەرئەوەی پەرستشی تیادا قبولەو وەردەگیرێت. (تفسيري الخازن والبغوي ٦/٢٦٤)

پ٣/ خودای گەورە بەدانانی شەوی قەدر جێ ی تەمەن کورتی ئومەتی ئیسلامی لەچاو ئومەتانی تردا پڕکردوەتەوە؟

وڵام/ (لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ) (القدر-٣)

واتە: شەوی قەدری بەڕێز لە هەزار مانگ ڕێزدارو خێردارترە (واتە پاداشتی عیبادەت و خواپەرستی ئەو شەوە زیاترە لەهەزارمانگ) زانایان دەڵێن ئومەتانی پیش ئیسلام تەمەنیان دریژ بووە لەو تەمەنە دریژدا عیبادەتێکی زۆریان بۆ خوای گەورە ئەنجام داوە و ئەجرو پاداشتێکی زۆریان بۆخۆیان کۆکردۆتەوە بەڵام تەمەنی ئومەتی ئیسلام کورتە لەچاو ئەوان وەکو پیغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێت: (أَعْمَارُ أُمَّتِي مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَي السَّبْعِينَ ، وَأَقَلُّهُمْ مَنْ يَجُوزُ ذَلِكَ) (وحسنه الألباني في صحيح الترمذي ٣٥٥٠)

واتە: (تەمەنی ئومەتەکەم لە نیوان شەست بۆ حەفتا ساڵە کەمێکیان نەبێت لەوە زیاتر دەکات) بە شێوەیەکی گشتی ئومەتی ئیسلام تەمنێکی کورتیان هەیە سەبارەت بە ئومەتانی تر، بەڵام خوای گەورە ئەم تەمەنە کورتەی بو جێ

کردونەتەوە کەوا شەوی قەردی بۆ داناون کەهەر کەسێك لەو شەوەدا ئاوەدانی بکاتەوەو زیندوی بکاتەوە بە عیبادەت کردن و پەرستنی خوای گەورە خێری هەزار مانگی بۆ ئەنوسریت کە هەشتاوسیٚ ساڵ و چوار مانگ دەکات، ئەویش ڕەحمەتی خوای گەورەیە بەم ئوممەتە تاوەکو غەم وخەفەت نەخۆن لەئوممەتانی تردوا نەکەون لەعیبادەت کردن و پەرستنی خودای گەورە دا.

ئەم شەوە کە لە هەموو شەوانی تری ساڵ خاوەن مەنزیلەت ترو خاوەن شەرەف وخاوەن پلەو پایە بەرزترە پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرموویێت: (فِيهِ لَيْلَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ،مَنْ حُرِمَ خَيْرَهَا فَقَدْ حُرِمَ)(رواه أحمد٨٧٦٩–صححه الألباني في صحيح الترغيب)

واتە: ڕەمەزان شەویێکی تیادایە (مەبەست شەوی قەدرە)خێروپاداشتی هەزار مانگی هەیە هەرکەسێك لە خێرو پاداشتی ئەو شەوە بیٚ بەش بێت، ئەوە بەڕاستی هەمووخێرێکی لەدەست چووە.

قتادە دەڵێت : (لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ) (القدر-٣) پەرستنی شەوی قەدر خێری زیاتر لەهەزار مانگی هەیە لەو شەوانەی کەقەدری تیادا نیە. (ابن ابي شيبة) لە (حسن) ەوە دەیگێڕێتەوە : هیچ ڕۆژێکم نەبینیوە فەزڵ و گەورەیی بێت بەسەر ڕۆژێك یان شەوێکی تردا جگە لە شەوی قەدر نەبێت خە یرو چاکەو پاداشتی هەزار مانگی هەیە.(الدر المنثور – ابن السيوطي ٥/٥٣٧)

پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت: (مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)(رواه البخاري-١٩٠١) (ومسلم -٧٥٩) واتە: وە هەر کەسیٚ شەوی قەدر هەڵسێت بە شەو نوێژو خواپەرستی بە ئیمانەوە وە چاوەڕێی پاداشتی بیٚ لە خوا ئەوە خوا لە هەمووتاوانەکانی پێشوی خۆش ئەبیٚ.

پ٤/ژمارەی ئەو مەلائیکەتانەی کە لە شەوی قەدردا دائەبەزن زیاترە لە ژمارەی وردە بەردەکانی سەرزەوی؟

وڵام/ ﴿تَنَزَّلُ الْمَلائِكَةُ والرُّوحُ فِيها رَبِّهِمْ مِن كُلِّ أمْرٍ﴾ بِإذْنِ (القدر-٤)

واتە: لەو شەوەدا فریشتە و (جیبرییل)یش لە ناویاندا دێنە خوارەوە بەفەرمانی پەروەردگاریان لەهەموو کاروبارێکدا.

(تَنَزَّلُ الْمَلائِكَةُ والرُّوحُ فِيها بِإذْنِ رَبِّهِمْ) فریشتەکان تیایدا دادەبەزن واتە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر چونکە فریشتەکان نیشتەجێ ی ئاسمانەکانن کە حەوت چینە لەوێوە دادەبەزن بۆ زەوی بەئیزن وڕێگەپێدانی خودای پەروەردگار، دابەزینی مەلائیکەت و دابەزینی (جبریل) یش ڕەحمەت وخەیرو بەرەکەتی لەگەڵە.

**(والرُّوحُ)** مەبەست (جبریل)ە خودای گەورە ناوی تایبەت کردووە وەکو فەزڵ وڕێزو پلەو پایە.

**( مِن كُلِّ أمْرٍ)** بە هەموو فەرمانێك لەلایەن خوای گەورەوە فرمانەکە شاراوەیە و نەزانراوە .بەڵام دابەزینی مەلائیکەت ڕەحمەت و بەرەکەتی لەگەلە. هەر شوێنێك فریشتەومەلائیکەت دەورەی بدەن ئەوا ڕحمەت و خەیرو بەرەکەتی تیا دادەبەزێت. (تفسیر ابن عثیمین /جزءعم/٢٧٠)

لەو شەوەدا فریشتەومەلائیکەتێکی ئیجگار زۆر دائەبەزن بۆسەر زەوی وەکو پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموویێت: (إنَّ الملائِكةَ تلْكَ الليلةَ في الأرْضِ أكثَرُ من عدَدِ الحَصَي) (الجامع الصغير-٧٧٠٧ ) واتە: (ژمارەی ئەو مەلائیکەتانەی کە لەو شەوەدا دائەبەزن زیاترە لە ژمارەی وردە بەردەکان) وردە بەردو وردە زیخی دونیا

چەندێك زۆرە ژمارەی ئەو مەلائیكەتانەی لەو شەوەدا دائەبەزن لەوە زیاترە. تفسير ابن كثير (٤٠٨/١٤)

پ٥/ قەدر شەوی ئاشتیی و سەلام و درووودو رەحمەتە؟

وڵام/ (سَلَامٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ الْفَجْرِ ) (القدر-٥)

واتە: ئەو شەوە ئاسوودەیی و ئاشتی و هێمنی و ڕەحمەت و میهرەبانیە، هەتا كاتی بەرەبەیان.

﴿سَلَامٌ هِي﴾(عطاء)دەڵێت: مەبەسەت لەم ئایەتە ئەوەیە مەلائیكەتەكان لە شەوی قەدردا سڵاودەكەن لەبەندە چاكانی خودا ئەوانەی گوێرایەڵی فرمانی خودان و خەریكی خوداپەرستین.

(الشعبی) دەڵێت: مەلائیكەتەكان لە شەوی قەدردا سڵاو لە ئەهلی مزگەوتەكان ئەكەن تا دەركەوتنی سپێدەی فەجرو بانگی بەیانی.

(الضحاك)دەڵێت: هیچ بڕیارێك نادرێت لەو شەوەدا تەنها ئاشتیی و سەلام درووودو رەحمەتە . (تفسير الخازن والبغوي ٤٧٠/٥)

﴿ حَتّى مَطْلَعِ الفَجْرِ﴾ واتە دەست پێ دەكات لە ئاوا بوونی خۆر تاوەكو دەركەوتنی فەجر و سپێدەبەیانی . (تفسير الشوكاني ٦٣٥/٥)

(سَلَامٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ الْفَجْرِ)(القدر-٥)(قتادة)و( ابن زيد) دەڵێن:واتە ئەو شەوەهەمووی خەیرو چاكەیە هیچ خراپەی تیادا نییە تاوەكوسپێدەی بەیانی.(تفسير ابن كثير ١٩٥/٤)

پ٦/ هێماو نیشانەكانی شەوی قەدر چیە ؟

وڵام/لەبارەی نیشانەكانی ئەم شەوەوە پیغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێت: (ليلة القدر ليلة طلقة،لاحارة ولا باردة،تُصبح الشمس يومها حمراء ضعيفة)(صحيح ابن خزيمة ٢٩١٢)

واتە: نیشانەی شەوی قەدریش ئەوەیە شەوێکی سافە نە ساردەو نە گەرمە، وە خۆریش کە بەیانییەکەی هەڵدێت سوورو لاوازە.

لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(ليلةُ القَدرِ في العشر البواقي، من قامهنَّ ابتغاءَ حِسبَتِهنَّ، فإن اللهَ تبارك وتعالي يغفِرُ له ما تقدَّمَ مِن ذنبه وما تأخَّر، وهي ليلةُ وترٍ:تسعٌ أو سبع أو خامسة أو ثالثة، أو آخر ليلة، وقال رسولُ الله: إنَّ أمارة ليلةِ القدر أنها صافيةٌ بلجةٌ، كأن فيها قمرًا ساطعًا، ساكنة ضاحيةً لا بَرْدَ فيها ولا حَرَّ، ولا يحلُّ لكوكبٍ [أن] يُرمي به فيها حتي يصبِحَ، وإن أمارتَها أن الشمس صبيحتَها تخرج مستويةً ليس لها شعاعٌ، مثل القمَرِ البَدرِ،لا يحِلُّ للشيطانِ أن يخرُجَ معها يومئذٍ) (مسند احمد ٢٢٧٦٥) (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد ١٣٣٨٠)

واتە : ليلةالقدر لە دە ڕۆژی کۆتای مانگی ڕەمەزانەوەیە هەر کەسێ شەوی قەدر هەڵسێت بە خواپەرستی وچاوەڕێی پاداشتی بێ لە خوا ئەوە خوا لە تاوانەکانی پێشوی خۆش ئەبێ، لەڕۆژە تاکەکاندا دەبێت نۆ یان حەوت یاپێنج یا سێ یاخود کۆتا شەو نیشانەی شەوی قەدریش ئەوەیە کە شەوێکی سافە نە ساردەو نە گەرمە، مانگ تیادا بەڕوونی دیارە وە لەو شەوەدا هیچ نەیزەکێك تێناگیرێت تا بەیانی، وە خۆریش کە بەیانییەکەی هەڵدێ سوورو لاوازە وەکو مانگ وایە هیچ تیشکێکی نییە، هەرگیز خۆر شەیتانی لەگەڵ نابێت.

پ٧/شەوی قەدر دەکەوێتە چی شەوێکەوە؟

وڵام/ عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّي تَوَفَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ) [بخاري / الاعتكاف/ ١٩٢٢]

(عائشة) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) : دەشەوی کۆتای ڕەمەزان لەمزگەوتدا دەمایەوە هەتا خوای گەورە بردیەوە بۆ لای خۆی، پاشان هاوسەرەکانی دوای خۆی ئەوکارەیان کرد.

لەفەرمودەیەکی تردا پیغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

عن ابْنَ عُمَرَ (رضي الله عنه) قالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) (الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ - يَعْنِي لَيْلَةَ الْقَدْرِ- فَإِنْ ضَعُفَ أَحَدُكُمْ أَوْ عَجَزَ فَلَا يُغْلَبَنَّ عَلَي السَّبْعِ الْبَوَاقِي) (بخاري/صلاة التراويح/١٩١١) (ابن عمر) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) : فەرمویەتی: (بگەڕێن بەشوێنی دە شەوی کۆتایدا- واتە شەوی قەدر- ئەگەر کەسێکتان بێ هێز بوو یان نەیتوانی با حەوتی کۆتایی لەدەست نەدات.

لەفەرمودەیەکی تردا پیغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

عن زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ (رضي الله عنه) قالَ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ (رضي الله عنه) فَقُلْتُ: إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، فَقَالَ: رَحِمَهُ اللَّهُ، أَرَادَ أَنْ لَا يَتَّكِلَ النَّاسُ، أَمَا إِنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، ثُمَّ حَلَفَ -لَا يَسْتَثْنِي- أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ. فَقُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ تَقُولُ ذَلِكَ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ؟ قَالَ: بِالْعَلَامَةِ -أَوْ بِالْآيَةِ- الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهَا تَطْلُعُ يَوْمَئِذٍ لَا شُعَاعَ لَهَا. (مسلم-٦٣١)

واتە: (زرِ ی کورِ ی حوبە یش) (خوای لیٚ رِازی بیٚت) دەلْیٚ: پرسیارم کرد لە (ئوبەی کورِی سعد) (خوای لیٚ رِازی بیٚت) و وتم (مسعود)ی برات دەلْیٚت: ئەوەی بەدریٚژای سالْ شەو و رِۆژ شەو نویٚژ بکات بەشەوی قەدر دەگات، دیارە رِەحمەتی خوای لیٚ بیٚ ویستویەتی خەلْکی پالْ نەدەنەوە، چونکە ئەو چاك دەزانیٚت کەلەرِەمەزاندایە، وە لە دە شەوی کۆتایشدایە و شەوی بیست و حەوتیشە، پاشان سویٚندی خوارد بەبیٚ دودلْی کە شەوی بیست و حەوتە، منیش ووتم: بەچ شتیٚك (بەلْگەیەك) ئەوە دەلْیٚیت ئەی (ابو منذر)؟ وتی بەو نیشانەو بەلْگەیەی کە پیٚغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسی فەرمووە، کە ئەویش ئەوەیە کاتیٚ خۆر هەلْدیٚت تیشکی نییە.

پ٨/ بۆ بەدەستهیٚنانی ئەو شەوە پیرۆزە پیویستە چی بکەیت؟

ولَام / عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ أَحْيَا اللَّيْلَ وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ، وَجَدَّ، وَشَدَّ الْمِئْزَرَ. [بخاري / صلاة التراويح/ ١٩٢٠]

واتە:(عائشە) (خوای لیٚ رِازی بیٚت) دەلْیٚ: پیٚغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتیٚ گەیشتە دە شەوی کۆتایی (رِەمەزان) شەوگاری (بەخوا پەرستی) دەبردە سەرو، خیٚزانەکانی هەلْدەسان و خۆی ماندوو دەکردو پشتویٚنی لیٚ قایم دەکرد بۆخودا پەرستی.

لەفەرمودەیەکی تردا دەی گیٚرِیٚتەوە.قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ وَافَقْتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فَمَا أَقُولُ؟ قَالَ:قُولِي اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي (صحيح سنن الترمذي٣٥١٣صححة الالباني)

واتە: دایکەعائیشە پرسیاری لە پیٚغەمبەر کرد(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەگەر گەیشتمە لیلةالقدر چی بلْیٚم فەرمووی ئەم دوعایە زۆر بکە: (اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ

الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي) واتە خوایە تۆ عەفو و لێبووردەی و لێبووردەیت خۆش ئەوێ خوایە لێمان ببوورە خوایە لێمان خۆش ببە.

پ٩/ ئەو ئامۆژگاریانەی فێری بویون لەسورەتی (القدر)؟

ولّام / فێری ئەم ئامۆژگاریانەی خوارەوە بوین:

١ ـ شەوێکە قورئانی پیرۆزی تیادا دابەزیووە :( إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ )

٢ ـ شەوێکی پیرۆزو موبارەکە : ( إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ )

٣ ـ شەوێکە خالّیە لەخراپەو خراپەکاری پڕەلەچاکەو چاکەکاری: ( سَلامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ )

٤ ـ شەوێکەفریشتەکان دێنە خوارە بۆ سەر زەوی لەگەڵ خۆیان خێر و بەزی وچاکە دەهێنن ( تَنَزَّلُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ )

٥ ـ شەوێکەخودای گەورەتیایدا ئەجەل و رزق و ڕۆزی بەندەکانی تیادا دەنوسێت ( فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ )

٦ـ شەوێکە پاداشتی چاکەتیادا دەگات هەزار سالّ (لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ )

٧ ـ شەوێکەپەرستن تیادا دەبێت هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانی پێشوو. (مَنْ قَامَ لَيْلَةَ القَدْرِ إيمَانَاً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنبِهِ)) (رواه البخاري و مسلم)واتە: وە هەر کەسێ شەوی قەدر هەڵسێت بە شەو نوێژو خواپەرستی بە ئیمانەوە وە چاوەڕێی پاداشتی بێ لە خوا ئەوە خوالەهەمووتاوانەکانی پێشوی خۆش ئەبێ.

٨ـ شەوێکە بۆخواپەرستی و دورکەوتنە لە چێژوو خۆشیەکانی دونیا (كَانَ النَّبيُّ صلى الله عليه وسلم إذَا دَخلَ العَشْرُ شَدَّ مِئزَرَه، وأَحْيى لَيْلَهُ، وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ) (رواه البخاري ومسلم)

واته:(عائشه) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێ گەیشتە دە شەوی کۆتایی (ڕەمەزان) شەوگاری (بەخوا پەرستی) دەبردە سەرو، خێزانەکانی هەڵدەسان و خۆی ماندوو دەکردو پشتوێنی لێ قایم دەکرد بۆخودا پەرستی

٩ـ شەوێکە بەسروشت لەشەوەکانی ترجیاوازە بەبەیانیەکەشیەوە:

( لَيْلَةُ الْقَدْرِ سَمْحَةٌ ، طَلِقَةٌ ، لا حَارَّة ، وَلا بَارِدَة ، تُصْبِحُ الشَّمْسُ صَبِيْحَتَهَا ضَعِيْفَةً حَمْرَاء) (أخرجهُ الطيالسي رقم : (٣٤٩) ، وابن خُزَيمة : (٢٣١/٣) ، والبزار : (٤٨٦/١) ، و سندهُ حَسَنٌ) واته: شەوێکی بێ دەنگ وڕوونە. نەگەرمەو نەساردەو خۆری بەیانیەکەی تیشکی لاوازو سوری دەبێت.

١٠ ـ شەوێکەخودایگەورەسورەتکی بەناویەوە ناردوەتە خوارە تاوەکورۆژی دوای دەخوێنرێتەوە. ....

**(وآخر دعوانا الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين )**

# * سەرچاوەکان*

١/ قورئانی پیرۆز
٢/ «الجامع المسند الصحيح المختصر من أُمور رسول الله صلي الله عليه وسلّم وسننه وأيامه» ناسراو بە( صەحیحی بوخاری) نوسینی أبو عبد الله محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة بن بَرْدِزبَالجعفي البخاري).ناسراو بە (ئیمام بوخاري)ساڵی وەفات ٢٥٦ هیجري
٣/ المسند الصحيح المختصر من السنن بنقل العدل عن العدل إلي رسول الله صلي الله علية وسلم ) ناسراو بە (صحيح مسلم)نوسینی أبو الحسين مسلم بن الحجاج بن مسلم بن ورد بن كوشاذ القشيري النيسابوري ناسراو بە (ئیمام موسلم)ساڵی وەفات ٢٦١ هیجری
٤/(الجامع لأحكام القرآن (تفسير القرطبي) نوسینی (محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي أبو عبد الله) تەحقیق کردنی (عبد الله بن عبد المحسن التركي) ساڵی دەرچوون ١٤٢٧ هیجری
٥/ (تفسير الخازن لباب التأويل في معاني التنزيل ) نوسینی (علاء الدين علي بن محمد بن إبراهيم بن عمر الشيحي أبو الحسن ) ناسراوبە( بالخازن ) ساڵی وەفات ٧٤١ هیجری
٦/تفسير القرآن العظيم (تفسير ابن كثير)نوسینی(إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي الدمشقي أبوالفداء عماد الدين)تەحقیق کردنی(سامي بن محمد السلامة) ساڵی دەرچوون ١٤٢٠هـ
٧/( صحيح سنن الترمذي) نوسینی(الترمذي ) تەحقیقکردنی (محمد ناصر الدين الألباني)ساڵی دەرچوون (١٤١٩ - ١٩٩٨)
٨/ (مجمع الزوائد ومنبع الفوائد) نوسینی(علي بن أبي بكر الهيثمي نور الدين) تەحقیقکردنی (المحقق) ساڵی وەفات (٨٠٧ هیجري)
٩/( صحيح ابن خزيمة) نوسینی(محمد بن إسحاق بن خزيمة السلمي النيسابوري) تەحقیقکردنی (محمد مصطفي الأعظمي - محمد ناصر الدين الألباني) ساڵی وەفات (٣١١هیجری)
١٠/( تفسير الشوكاني)نوسینی(محمد بن علي بن محمد الشوكاني،الملقب بـبدر الدين الشوكاني) ساڵی وەفات (١٢٥٠ هیجری)

١١/(صحيح الجامع الصغيروزيادته)نوسینی(محمدناصرالدين الألباني)ساڵی دەرچوون ١٤٠٨ھ)
١٢/( تفسير القرآن الكريم (تفسير العثيمين) نوسینی(محمد بن صالح العثيمين)
١٣/ /(تفسير الدر المنثور في التفسير بالمأثور) دانانی (عبد الرحمن بن كمال الدين أبي بكر بن محمد سابق الدين خضر الخضيري الأسيوطي ) جلال الدين السيوطي، ( تەحقيق كردنی (عبد الله بن عبد المحسن التركي) ساڵی وەفات ( ٩١١هيجری)
١٤ / (حديث المساء من الدروس والمحاضرات والتعليقات بنباز) نوسینی(عبدالعزيز بن باز) تەحقيقكردنی (صلاح الدين عثمان أحمد) ساڵی دەرچوون (١٤٣٢ هيجری)
١٥/(صحيح الترهيب والترغيب نوسینی (محمد ناصرالدين الألباني )ساڵی دەرچون ١٤٢١ھ
١٦/(مسند الإمام أحمد بن حنبل) دانانی (أحمد بن حنبل) تەحقيق كردنی (شعيب الأرناؤوط وآخرون) ساڵی وەفات (٢٤١ هجری)

## * سەرچاوەکوردیە کان*

**١/ (تەفسیری ڕێبەر ) نوسینی (م. محمد عبدالكريم ) ساڵی دەرچون ١٤٤٠ هیجری**
**٢/ (تەفسیری ڕامان) نوسینی ( مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود) ساڵی دەرچون ١٤٢٦ هیجری**
**٣/ (تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان) نوسینی ( برهان محمدأمين)**
**٤/ (پوختەی تەفسیری قورئان ) نوسینی (محمد مەلا صالح)**
**٥/ (تەفسیری گوڵشەن) نوسینی ( نڤام الدين عبد الحميد) چاپی یەکەم ١٤٢٤ھ**